

# ڕۆشنایی قورئان

کۆکردنەوەی :

باوکی مەریەم







اللَّهمَّ إجْعَلَ الْقُرْآنَ العَظِيمَ رَبِيعَ قُلُوبِنا وَنُورَ صُدُورِنَا وَجَلاَءَ أَحْزَانِنَا وَذَهَابَ هُمُومِنَا ، اللهم اجعل القرآن حجة لنا ولا تجعله حجة





الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ

مرۆڤ لەوە لاوازترە کە بەرگەی ئەو هەموو تاقیکردنەوە و ناخۆشیانەی ژیان بگرێ بە بێ وتەکانی پەروەردگاری ،بۆیە تا قورئان نەکەینە چارەسەر بۆ هەرچی کێشەی دەروونی و جەستەیی و کۆمەلایەتیە ئەوا هەر دەردەدارین

کەناڵی تیلیگرام: https://t.me/Quran_Kurde





# پێڕست







# پێشەکی

بسم الله، والحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه. أما بعد:

قورئانی پیرۆز کەلامی الله تعالى یە و مەخلوق نیە ، لەلایەن ئەوەوە دابەزیوە ، الله تعالى دەفەرموێت: {وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ} [الشعراء ١٩٢]

وە دەفەرموێت: {تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ} [السجدة ٢]

و پەروەردگار خۆی بەحەقیقەت قسەی پێ کردووە

الله تعالى دەفەرموێت: {وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ} [التوبة ٦]

وە دەفەرموێت: {تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ} [البقرة ٢٥٣]

وە دەفەرموێت: {وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا} [النساء ١٦٤]

و درووستکراوێك نیە لە درووست کراوەکانی، بەڵکو ووتە (کلام)ی خۆیەتی، کەلامیش سیفەتێکە لە سیفەتەکانی پەروەردگارمان، وە بە







فریشتەی وەحی جبریلدا علیه السلام دایبەزاندووە و ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرمان محمد ﷺ بە زمانی عەرەبی، کە بە سوورەتی (الْفاتِحة) دەست پێ دەکات و بە سورەتی (النَّاس) کۆتایی پێ دێت.

قورئان هیدایەت و رەحمەت و نور و ئامۆژگاری و هۆشیارکەرەوەیە ، جیاکردنەوەی حەق و باطلە ، بە خوێندنەوەی پاداشت وەردەگرین لەسەری، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: هەرکەسێک پیتێک لە کتێبی الله بخوێنێتەوە ئەوە چاکەیەکی بۆ هەیە ، وە چاکەش بە دە ئەوەندەی خۆیەتی ، نالێم «ألم» پیتێکە ، بەڵکو «ألف» پیتێکە وە «لام» پیتێکە وە «میم» پیتێکە. [رواه الترمذي ٢٩١٠ ]

وە بۆ ئەوەش دابەزیوە هەتا خەڵکی دەربهێنێت لە تاریکاییەکانی کوفر و هاوەڵ بڕیاردان و بت پەرستیەوە بۆ نور و ڕۆشنایی ئیمان و ئیسلام. الله تعالى دەفەرمویت: {الر كِتَابٌ أَنْزَلْنَاه إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ} [إبراهيم ١]

واتە: ئەلف لام را ، ئەم قورئانە کتێبێکە دامانبەزاندووە بۆت ئەی محمد ﷺ تا خەڵکی لە تاریکیەکانی (بێ باوەڕی و نەزانی و سەرلێشێواوی) دەربهێنێت، بەرەو نوورو ڕێبازی ڕۆشنایی ئیمان، بە ئیزنی







پەروەردگاریان، تا دەگەنە ڕێبازی ڕاستی پەروەردگاری بە دەسەلات و سوپاسکراو

الله تعالی بۆ ئەوە ناردوویەتی هەتا خەڵکی بیخوێننەوە و لێی تێ بگەن و بیری لێ بکەنەوە و کردەوەی پێ بکەن

الله تعالی دەفەرموێت: {إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا} [الإسراء ٩]

وەدەفەرموێت: {لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ} [الأنبياء ١٠]

وە دەفەرموێت: {إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ فَمَنِ ٱهْتَدَى فَلِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا  وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ} [الزمر ٤١]

خوێندنەوەی پەرستش و عیبادەتە، بگرە لە گەورەترین جۆرەکانی زیکر و یادی الله یە , وە ئەم قورئانە بۆ ئەمرکردنە بە تاک ڕاگرتنی الله تعالی لە عیبادەتەکاندا و شەریک بریار نەدان بۆی وە ترساندنی ئەو کەسانەی شەریک بریار دەدەن و کافر و تاوانبارن ، الله تعالی دەفەرموێت:

{هَذَا بَلَاغٌ لِلنَّاسِ وَلِيُنْذَرُوا بِهِ وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ} [ابراهيم ٥٢]





ئەم قورئانە پیرۆزە، پەروەردگار وەك موعجیزەیەکی گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرمان ﷺ کە بەچەندین شێوازی جیاجیا تەحەددای بێباوەڕان دەکات، بۆیە هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ و هەتا ئێستاش بێباوەڕان نەیانتوانیوە وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، یان وێنەی سورەتێکی قورئان بهێنن، تەنانەت دەستەوستانن لەوەی کە بتوانن وێنەی تەنها یەك ئایەتیش بهێنن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ، الله تعالى دەفەرموێت:
{وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِ[مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ} [البقرة ٢٣]

وە دەفەرموێت: {قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا} [الإسراء ٨٨]

الله تعالى دەربارەی قورئان دەفەرموێتٍ: {وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ، عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ ، بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ} [الشعراء ١٩٢ – ١٩٥]

واتە: بێگومان ئەو قورئانە نێردراوی پەروەردگاری جیهانیەکانە،
(جبریل)ی دەستپاك و ئەمین هێنایە خوارێ، بۆسەر دڵی تۆ، تا ببێتە یەکێ







لە ترسێنەران و خەڵکی پێ بترسێنی، ئەمیش بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و ئاشکرا دابەزێنراوە، تا هیچ بڕو بیانوویەکیان نەمێنێ.

هیچ جێگای سەرسورمان نییە کە قورئان هەرچی یاسای پێداویستی ژیانی ئادەمیزادە لە خۆی گرتبێ و هیچ شتێکی پاشگۆی نەخستبێ و دەستورێکی تەواو و گونجاو بێ بۆ ژیانی مرۆڤ ، الله تعالى دەفەرموێت {مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ} [الأنعام ٣٨]

وە دەفەرموێت: {وَلَقَدْ جِئْنَهُم بِكِتَبٍ فَصَّلْنَهُ عَلَى عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ} [الأعراف ٥٢]

بەم قورئانە پیرۆزە پێغەمبەر ﷺ تەحەدای لە عەرەب کرد کە بتوانن وێنەی ئەو کەلامە بخەنە روو ، کە بە زووبانی ئەوان نازل بووە و لەو پیت و وشانەی ئەوان ئاخاوتنی پێدەکەن پێکهاتووە ، الله تعالى دەفەرموێت: {وَ هَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ} [النحل ١٠٣]

ئەوانیش شانازییان بە بەلاغەت و رەوانبێژی خۆیان دەکرد ، کەچی لە بەرامبەر موعجیزە و رەوانبێژی قورئان دا نەیانتوانی وێنەی قورئان بخەنە روو ، تەنانەت نەیان توانی دە سوورەت بەڵکوو سورەتێک وەک سورەتێکی قورئان دابنێن و تا ئێستاش نەک هەر قورەیش بەڵکو





ئادەمیزاد بە عەرەب و نا عەرەبەوە بە (جنۆکە)کانیشەوە نەیانتوانیوە ئەو تەحەددایەی قورئان ئاراستەی کردوون وەڵام بدەنەوە .

پەیامی قورئان هەر بۆ ئادەمیزاد نیە و بەس ، بەڵکو جیهانی جنۆکەشی گرتیتەوە ، واتە قورئان بۆ عالەمی ئادەمیزاد و جنۆکەیە ، الله تعالی دەفەرمویت:

{وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ، قَالُوا يَقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَبًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ، يَقَوْمَنَآ أَجِيبُوا دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ} [الأحقاف ٢٩ - ٣١]

قورئانی پیرۆز هەموو موشکیلەکان حەڵ دەکا ، لە هەموو باردۆخێکدا گرێ و کێشەی رۆحی بن عەقڵی بن جەستەیی بن کۆمەلایەتی بن ئابووری بن سیاسی بن هتد... بە حەکیمانە چارەسەریان دەکا ، چونکە ئەم قورئانە لە لایان زاتێکی حەکیم نازل بووە ، بۆ هەموو دەردێک دەرمانە و شیفایە ، بۆ هەموو زەمان و سەردەمێک یاسای گونجا و سوودبەخشی هەیە فەرمان دەکا تا پەیرەوی بکەین.





قورئان دەستورێکە لە هەموو کات و شوێنێکدا ئینسان دەتوانێ بیکاتە یاسای خۆی و پەیرەوی بکا و خۆشبەختی دونیا و قیامەتی پێی دەستەبەر بکا .ئەو ژیانەی مرۆڤاتیەی ئەمڕۆ لە ناخی خۆی دا ئازار دەچێژی و یاسا و دەستووری لێ چەواشە بووە ، رەوشت و ئەخلاقی ڕۆخاوە ، جگە لە قورئان ڕزگارکەرێکی تری نیە تا لەم گێژاوەی ژیانە ڕزگاری بکا و ئەمن و ئاسایشی پێ ببەخشێ و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری کا. الله تعالی دەفەرموێت: {قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢا بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ، وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ} [طه ١٢٣-١٢٤]

یەکێک لە کردارە گەورەکان کە الله تعالی فەرمانی پێکردووە بە پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران کە بیکەن خوێندنەوە و کارپێکردنیەتی و کردنیەتی بە دەستور و حوکمی ولات و بە وە لە نێوان خەلکی حوکم بکرێت ، الله تعالی دەفەرموێت:

{إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاه ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ} [یوسف ٤٠]

بەس ئێستا بەداخەوە لە جیاتی قورئان دەستوری شەرق و غەرب کراوە بە حوکم و خەڵکی حوکمی پێدەکەن، قورئان و یاسای الله تعالی یان







وەلاناوە وە قورئان بە تەواوەتی هەجر کراوە لە لایەن خەڵکیەوە، خوێندنەوە و دەورکردنەوەی و تێگەیشتن لە قورئانیان وازلێهێناوە لە کاتێکدا سەلەفی ئێمە هەموو کاتەکانی ژیانیان بۆ قورئان تەرخان کردبوو بە قورئانەوە دەرۆشتن و بە قورئانەوە دادەنیشتن و هەڵدەستان، وە لە هەمووی جێی داختر هەجرکردنی قورئان و نەخوێندنەوەیەتی لە لایەن موسلمانانی ئە هلی سونە و طالب العلم کان شەیتان زالبوە بەسەریاندا و بە بیانووی ئەوەی عیلم دەخوێنن و فێری زانستی شەرعی دەبن و خەریکی ئیشی و کەسابەت و ماڵ و منداڵن وازیان لە خوێندنەوەی قورئان هێناوە بە جۆرێک لە شەو رۆژێکدا هیچ بەشێکیان نیە لە قورئان خوێندنەوە و تێگەیشتنی جا ئەبێت چ خێریک لەو عیلمە و کەسابەتەی دا هەبێت کە قورئانی بۆ هەجر بکرێت ؟!! .

## هەندێک لە ناو و سیفاتەکانی قورئان:

١ _ القرآن: {إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا}. [الإسراء ٩]

٢ _ الكتاب: {لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ  أَفَلَا تَعْقِلُونَ} [الأنبياء ١٠]





٣ _ الذكر: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ} [الحجر ٩]

٤ _ الفرقان: {تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَـٰلَمِينَ نَذِيرًا} .

[الفرقان ١]

## صیفەتەکانی قورئان:

١ _ هدى ، شفاء ، رحمة ، موعظة:

{يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ} [يونس ٥٧]

٢ _ مبارك: {وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ}.

[الأنعام ١٥٥]





# هەجرکردنی قورئان

وَقَالَ الرَّسُولُ يَارَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا

جۆرەکانی هەجرکردنی قورئان:

یەکەم: پشتی تێ دەکات و گوێی بۆ ناگرێ و ئیمانی پێی ناهێنێت.

دووەم: پشتی تێ دەکات و کاری پێ ناکات و گوێ ناداتە حەرام و حەلاڵەکەی، ئەگەرچی خوێندبێشیەوە و ئیمانی پێی هێنابێت.

سێیەم: پشتی تێ دەکات و حوکمی پێ ناکات لە هەموو ڕوویەکەوە، بڕوای وایە، کە ئەمە شتێکە تەنها وتەیە و باوەڕ پێکراو نیە.

چوارەم: پشتی تێ دەکات و لێی ووردنابێتەوە، تا بزانێت الله تعالی چی پێ مەبەستە.

پێنجەم: بۆ نەخۆشی دڵ و دەروون سودی لێ نابینێت و پشتی تێدەکات، بەڵکو ڕوو دەکاتە غەیری قورئان و سوود لە قورئان وەرناگرێت.





هەجركردنی قورئانی پیرۆز حوكمەكەی دەگۆڕێت، بەپێی جۆر و حاڵەتی هەجر كردنەكەو حاڵ و باری ئەو كەسەش كە هەجرەكە دەكات، بەڵام هەجر كردن بەهەر حاڵ و بارێك بێت و هەر كەسێك بیكات، هەر سەرزەنشت كراوە و موسوڵمان تاوانبار دەبێت، تاوانەكەشی بەپێی جۆری هەجرەكە دەگۆڕێت، هەندێك جۆری هەجر كردن هەیە كوفرە و كافر دەبێت، هەندێكی تر هەیە تاوانە.

مرۆڤی موسڵمان لە هەجر كردنی قورئان ڕزگاری نابێت مەگەر بەوەی ڕۆژانە بیخوێنێت و روو لە قورئان بێت ، وە لێی ورد بێتەوە و لە ماناو مەبەست و حوكمەكانی تێ بگات و كاری پێ بكات حوكم بەوە بكات كە تیایەتی ، خوێندنەوەی قورئان بە كردەوە پێكردنی باشترین و پر قازانجترین كردارە و هۆكارە بۆ رەزامەندی الله تعالى ، وە بە دەست هێنانی پاداشتی نەبراوە ، وە ڕزگار بوونە لە تووڕەیی و سزاكەی الله تعالى .





## فەزڵ و گەورەیی خوێندنی قورئان و کارپێکردنی

١ _ البراء الله لێی ڕازی بێت دەڵێ: پیاوێك سورەتی (الكهف)ی دەخوێند، ئەسپێکی لەلاوە بوو بە دوو گوریسی درێژ بەسترا بوویەوە، پەڵە هەور دایگرتەوە، هەربەسەریەوە سوڕی دەخوارد و لێی نزیك دەبوویەوە، ئەسپەکەیشی هەر لێی ئەسڵەمیەوە، کاتێ ڕۆژ بوویەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد. فەرمووی: ئەوە هێوری و ئارامی بووە لەبەر قورئان دابەزیوە

[رواه البخاري ٤٧٢٤]

٢- پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: نموونەی بڕواداری قورئان خوێن وەك نموونەی بەهێیە، واتە بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە، بڕواداری قورئان نەخوێنیش وەك خورما وایە، بۆنی نییە و تامی شیرینە، دووڕووی قورئان خوێن وەك ڕەیحانە وایە بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، دووڕووی قورئان نەخوێنیش وەك کوژاڵکەوایە، بۆنی نییە و تامیشی تاڵە

[رواه البخاري ٤٧٣٢]





٣_ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمویێت: قورئان ئەبێتە بەڵگەیەک بۆت،یانیش ئەبێتە بەڵگەیەک لەسەرت.

[رواه مسلم٢٢٣]

٤_ پێغەمبەری الله ﷺ بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرمووو: اللەی عز وجل فەرمانی پێکردووم کە سورەتی {لم یکن الذین کفروا}ت لەلا بخوێنم ، ئوبەی فەرمووی: الله بۆخۆی ناوی منی هێنا بۆت؟

رسول الله ﷺ فەرمووی: بەڵێ

ئیتر ئوبەی لەخۆشی ئەوەی کە الله ئەو دەستی قەدرو ڕێزەی لێناوە دەستی کرد بەگریان

[رواە البخاري ٣٨٠٩ ، و مسلم ٧٩٩]

٥_ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمویێت: ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، شەیتان لەماڵێك ئەڕوا کە سورەتی (البقرة) تێدا بخوێنرێت.

[رواه مسلم ٧٨٠]





٦_گوێگرتنی پێغەمبەر ﷺ لە قورئان خوێندنی خەڵك.

عبدالله ی کوڕی مسعود الله لێ ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری الله ﷺ پێی فەرمووم: قورئانم بۆ بخوێنە دەڵێ:

وتم: ئەی پێغەمبەری الله ﷺ قورئان بۆتۆ بخوێنم کە بۆ تۆ دابەزیووە؟ فەرمووی: من حەز دەکەم لە غەیری خۆمەوە گوێم لێبێت منیش (النسأء)م خوێند، هەتا گەیشتمە: {فكيف إذا جئنا من كل أمة بشهيد و جئنابك على هؤلاء شهيدا ٤١} سەرم هەڵبڕی یا پیاوێك لەلامەوە ئاماژەی کردم سەرم هەڵبڕی دەبینم چاوەکانی فرمێسکی لێهەڵنیشتووە.

[رواه بخاري ٤٧٦٨]

٨_ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموێت: بێگومان ئەو کەسەی شتێک لە قورئان لە دڵیدا نییە ، وەک خانوویەکی ڕووخاو وایە.

[هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَأَخْرَجَهُ أَحْمَدُ وَالدَّارِمِيُّ وَالْحَاكِمُ , وَقَالَ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ]





٩ _ پێغەمبەری الله ﷺ ئەفەرموێت: واتە: ئەو کەسەی کە هاوڕێی قورئانە وەکو ئەوە وایە کە حوشترێك ببەستێتەوە ئەگەر بەردەوام لەگەڵیدا بیت ئەویش لەگەڵت ئەبێت، وە ئەگەر بەری دەیت ئەویش ئەڕوات و نامێنێت.

[رواه مسلم ٧٨٩ ]

١٠ _ پێغەمبەری الله ﷺ ئەفەرموێت: قورئان بخوێنن، ڕۆژی قیامەت دێت دەبێتە شفاعەتکار بۆ خاوەنەکەی.

[رواه مسلم ٨٠٤]

١١ _ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموێت: باشترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان دەکا و خەڵکی تریش فێر دەکات.

[رواه البخاری ٥٠٢٧]

١٢ _ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموێت: الله تعالی بەهۆی ئەم قورئانە کەسانێک بەرز دەکاتەوە و کەسانیکیشی پێ دادەگرێت.

[رواه مسلم ٨١٧]



قورتوبی دەڵێ: الله تعالی بەرزی دەکاتەوە واتە ڕێزی لێ دەنێت ، ئەوەش بەهۆی گرنگی پێدانی ئەو کەسەیە بە قورئانی پیرۆز و فێربوون و شارەزابوون و کردەوە پێکردنیەتی ، وە ئەو کەسەش کە نزمی دەکاتەوە بەهۆی وازەێنانی ئەو کەسەیە لە قورئان و شارەزانەبوون و کردنەوە نەکردن پێی.

[المفهم ٥/٣١٤]

١٣ _ گەورەیی (آية الكرسى)

ابی کوڕی لعب الله لێ ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی: ئەی أبو المنذر دەزانی چ ئایەتێك لە کتێبی الله ی باڵادەست لەهەمووان گەورەترە؟ دەڵێ: وتم: الله و پێغەمبەری الله زاناترن، فەرمووی: ئەی أبو المنذر دەزانی چ ئایەتێك کەلە خزمەتیدای، لە کتێبی الله ی باڵا دەست لە هەمووان گەورەترە، وتم: (الله لا اله الا هو الحي القيوم) [البقره ٢٥٥] دەڵێ: دەستی دابەسنگما و فەرمووی: (والله پێکاوتە زانست و زانیاریت لێپیرۆز بێت ئەی (أبو المنذر).

[رواه مسلم ٨١٠]



١٤ _ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمویێت: بە هاوەڵ و دۆستی قورئان دەوترێ: قورئان بخوینەرەوە و بەرز بەرەوە ، هەروەک چۆن لە دونیادا دەتخویندەوە ، شوێنی تۆ لەگەل تەواو بوونی کۆتا ئایەت دایە کە دەیخوینیتەوە.

[روى الترمذي ٢٩١٤ ، وأبو داود (١٤٦٤]

١٥ _ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمویێت: ئایا هەر یەکێک لە ئێوە پێی خۆشە پێی خۆشە کە گەرایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و سێ وشترِی گەورەی قەڵەی ئاوسی تێدا بەدی بکات ؟ وتمان: بەڵێ ، فەرمووی: سێ ئایەتی قورئانی پیرۆز بخوێنیت لە نوێژێکدا باشترە بۆی لە سێ وشتری گەورەی ئاوسی قەلەو. [رواه مسلم ٨٠٢]

١٦ _ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمویێت: هیچ کەسانێک نین کە لە مالێک لە ماڵەکانی الله تعالی کۆ بوبێننەوە و کتابی الله بخوێننەوە و دیراسەی بکەن لە نێوان خۆیاندا ، ئیلا هێمنی و سووکنایی دائەبەزێتە سەریان ، وە ڕەحمەت و بەزەیی الله تعالی دایاندەپۆشی ، و مەلائیکەتەکان دەوریان دەدەن ، الله تعالی ش لە لای ئەوانەی لای خوێن و نزیکین باسیان دەکا.

[رواه مسلم ٢٦٩٩]





١٧ _ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموێت: {هەرکەسێک پیتێک لە کتێبی الله بخوێنێتەوە ئەوە چاکەیەکی بۆ هەیە ، وە چاکەش بە دە ئەوەندەی خۆیەتی ، ناڵێم «ألم» پیتێکە ، بەڵکو «ألف» پیتێکە وە «لام» پیتێکە وە «میم» پیتێکە.

[رواه الترمذي ٢٩١٠ ]

١٨ _ پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموێت: نموونەی ئەو ئیمانداراەی کە قورئان دەخوێنێت وەک شەمامە وایە «جۆرە میوەیە کە زۆر تام و بۆنی خۆشە ، وە رەنگیشی جوانە وە نەرمە» ، وە ئەوەی کە قورئان ناخوێنێت وەک خورما وایە ، تامی خۆشە بەڵام بۆنی نییە ، وە نموونەی ئەو فاجر و خراپەکارەی کە قورئان دەخوێنێت وەک «ڕەحیانە» وایە ، بۆنی خۆشە بەڵام تامەکەی تاڵ و ناخۆشە ، وە نموونەی ئەو خراپەکارەی کە قورئان ناخوێنێت وەک گوژالک وایە خواردنی تاڵە وە بۆنیشی نیە.

[رواه البخاري ٥٠٢٠ ، مسلم ٧٩٧]

١٩ _ خوێندنەوەی قورئان و کارپێکردنی یەکێکە لە گەورەترین نیعمەتەکان کە موسڵمانان پێشبڕکێی تێدا بکەن





پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئیرەیی دروست نیە تەنها بۆ دوو شت نەبێت ، پیاوێک الله تعالى ماڵێکی پێ بەخشیوە و شەو رۆژ لە پێناوی الله دا دەبەخشێت ، وە پیاوێکیش الله تعالى قورئانی پێ بەخشیبێت وە ئەویش بە شەو و رۆژ ئەیخوێنێتەوە و بیری لێدەکاتەوە و کردەوەی پێ دەکات.
[رواه البخاري ٥٠٢٥ ، مسلم ٨١٥]
ووتم: ئەم جۆرە حەسوودیە پێی دەوترێت (الغبطة) ئەوەیە کە ئاوات بخوازی کە الله تعالى ئەو نیعمەتەش بە تۆ ببەخشێت کە بە فڵانی بەخشیوە ، بێ ئەوەی ئاواتی ئەوەت هەبێت الله تعالى لەوی وەربگرێتەوە .

ابن مسعود رضي الله عنه دەفەرموێت : هەر کەسێک پەنجا ئایەت بخوێنیت لە شەودا ئەوا لە بێ ئاگایاندا نانوسرێت وە هە ر کەسێک سەد ئایەت بخوێنیت ئەوا ئەنوسرێت لە ملکەچ کاران وە هەر کەسێک سێ سەد ئایەت بخوێنێت چیایەک لە چاکەی بۆ دەنوسرێت وە هەر کەسێک حەوت سەد ئایەت بخوێنیت ئەوا دەرگای خێر و چاکە و تێگەشتن لە قورئانی بۆ دەکرێتەوە.
[المصنف لإبن أبي شيبة ٣٠٦٩١]





سفيان الثوري دەلێت: باشترین زیکر خوێندنەوەی قورئانە لە نوێژدا ، پاشان خوێندنەوەی قورئان لە غەیری نویژدا ، پاشان رۆژوو، پاشان زیکر

[حلية الأوليا ٧/٦٧ ]

ابن عباس دەفەرموێت: هەر کەس گوێ لە ئایەتێك بگرێت لە قورئان ، ئەوە بۆی دەبێت بە رووناکی لە رۆژی قیامەتدا.

[المصنف عبد الرزاق ٦٠١٢ ]

ابن مسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوە مەبەست پێی تەنها رەزامەندی الله یە ئەوا بۆ هەموو پیتێک دەچاکەی پێدەگات و دەخراپەشی لێ دەسرێتەوە.

[المصنف لإبن أبي شيبة ٣١٩٢٧]

كعب الأحبار دەلێت: ئەو کەسەی سەد ئایەت بخوێنیت لەشەودا ئەوا دەنوسرێت لە ملکەچ کاران

[المصنف لإبن أبي شيبة ٣٢٠٧٩ ]





ابو هريرة رضي الله عنه دەفەرموێت: ئەو کەسەی سەد ئایەت بخوێنیت لە شەودا ئەوا لە بێ ئاگایان نانوسرێت وە ئەو کە سەی دووسەد ئایەت بخوێنیت ئەوا دەنوسرێت لە ملکەچ کاران .

[المصنف لإبن أبي شيبة ٣٢٠٨٠ ]

پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموێت: الله تعالى ئەهلی خۆی هەیە لە خەڵکی پێی وترا: کێن ئەوانە یا رسول الله؟ فەرمووی: ئەهلی قورئانن ئەوانە ئەهلی الله تعالى و بژاردەی ئەون.

[المسند لإمام أحمد ]

پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموێت: باشترینتان ئەوانەن کە قورئان فێردەبن و خەڵکیش فێردەکەن.

[رواه البخاري ٥٠٢٧]

ابن سيرين دەفەرموێت : ئەو ماڵەی قورئانی تێدا دەخوێندرێت ، مەلائیکەت تێیدا ئامادە دەبن ، وە شەیطانەکان دەرۆن و ڕادەکەن تێدا ، وە فراوان دەبێت بۆ دانیشتوانەکەی وە خێریشی زۆر دەبێت.

[مصنف ابن ابی شیبە ٣٢٠١٨ ]





أم الدرداء دەفەرموێت: چومە ژورەوە بۆ لای عائشە پێم ووت: فەزڵی ئەو کەسە چییە کە قورئان ئەخوێنێ بە سەر ئەو کەسەی کە نایخوێنێ لە کاتی چوونە بەهەشت؟

فەرمووی: دەرەجە و پلەکانی بەهەشت بە پێی ئایەتەکانی قورئانەوە هیچ کەسێکیش نییە بچێتە بەهەشت باشتر بی لە خوینەری قورئان.

[مصنف ابن أبي شيبة ٣٠٥٥٤ ]

ابن عباس دەفەرموێت : الله تعالى مسۆگەری کردووە بۆ ئەو کەسەی کە شوێنکەوتەی قورئانە کە لە دونیا گومرا نابێت وە لە دوا رۆژیشدا بەدبەخت نابێ ، دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى}.

[مصنف ابن ابي شيبة ٣٠٥٥٨]

ئیمامی شافعی دەفەرموێت: هەر کەسێک قورئان بخوێنێتەوە گرانبەها دەبێت.

[الآداب الشرعية لابن مفلح ٢٣١ ]





ابن مسعود دەفەرمویّت: هەر کەسێک قورئانی خۆشدەویّت مژدەی لێبێت.

[سنن الدارمی ٣٣٧٥ ]

خیثمە بە خێزانەکەی دەفەرمویّت: نەکەی کەسێک بێنیتە مالەکەم کە مەشروب دەخواتەوە ، واتە دوای من شوو بکەیتەوە بە مەشروب خۆرێک، پاش ئەوەی ماڵەکەم لە هەر سێ رۆژ جارێک قورئانی تێدا خوێندراوەتەوە- خەتمی کردوە.

[سنن الدارمی ٣٣٧٨ ]

عثمان کوری عفان رضي الله عنه دەفەرمویّت : ئەگەر دلەکانمان پاک بوونایە ئەوا هەرگیز تێر نەدەبوو لە کەلامی الله تعالى .

السنە لحرب الکرمانی ٣٩٩ ]

ابن مسعود رضي الله عنه دەفەرمویّت : زۆر قورئان بخوێنن پێش ئەوەی لە ناوتان نەمێنی و بەرز بکرێتەوە.

[أخرجە الدارمي ٣٢٠٧ ]





ابن مسعود دەفەرموێت: هەر کەسێک قورئان خەتم بکات دوعایەکی گیراو وەلام دراوەی بۆ هەیە.

[مختصر منهاج القاصدين ١/٥٣]

أنس کوڕی مالک: کاتێک قورئانی خەتم دەکرد خێزان و مندالەکانی کۆدەکردەوە و دوعای دەکرد.

[مصنف ابن ابي شيبة ]

الحکم دەلێت: مجاهد ناردی بە دوامدا، وتی ئێمە بانگمان کردی ، ویستمان قورئان خەتم بکەین، دە وترا ؛ دوعا کردن لە کاتی خەتم کردنی قورئاندا وەردەگیرێت ، پاشان چەند دوعایەکی کرد.

[مصنف ابن ابي شيبة ]

ابن مسعود دەفەرموێت : لە رۆژی قیامەتدا قورئان دەهێنرێت، شەفاعەت بۆ خاوەنەکەی دەکات و بۆی دەبێتە پێشرەو بۆ بەهەشت - ئەگەر کاری پێکردێت یان شاەیدی لەسەر دەدات و پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئاگر ئەگەر کاری پێنەکردبێت.

[سنن الدارمی ٣٣٧٧ ]





وەیب کوری الورد دەڵێت: قورئان خویندنەوەکەت بکە بەکردەوە، مەیکە تەنها بە عیلمێک بە بێ کردەوە.

[سنن الدارمی ٣٣٦٥ ]

حسن البصری دەفەرموێت: قورئان بۆ ئە وە دابەزێنراوە تاوەکو کاری پێبکرێت دەست بگرن بە خوێندنەوەی قورئان تا دەگەن بە کارڕکردن پێی.

[مفتاح دار السعادة ١/١٨٧ ]





# تەدەبور

گەر تەدەبور کردن لە قورئانی پیرۆزدا بۆ ئەو مەبەستە بێ کە الله تعالی داوای لێکردووین لە قورئاندا ئەوا کارێکی زۆر چاک و بەهرەمدارە لە سەرووی هەمووشیان ناسینی الله تعالی و فێربوونی تەوحید و دوورکەوتنەوە لە شیرک کە ئەمە کرۆکی قورئانە گەر مرۆڤ تەدەبور کردن لە قورئاندا ماناکانی تەوحیدی لەلا بەهێز کرد و شیرك و سەرچاوەکانی لە لا ناساند و ناشرین کرد ئەوا جوانترین تەدەبوری کردووە لە قورئاندا ئەگەرچی نەخوێندەوار بێت و نەزانی تەدەبور مانای چیە بەلام گەر ئەم مەبەستەی دەست نەکەوت لە قورئان خوێندنەوە دا ئاوا بێ ئاگایە لە کەلامی الله تعالی ئەگەرچی جوانترین تەدەبور بکات لە بوارەکانی تردا و مانای زۆر وورد و جوان دەربهێنیت لە ئایەتەکاندا وە تەدەبور کردن بە بێ کارکردن پێی ئەوا هیچ سودێکی نیە و تەنها بارە بە سەرشانی خاوەنەکەیدا بۆیە هەموو ئامانج لە گوێگرتن و خوێندنەوە و لەبەرکردن و تەفسیرکردن و تەدەبورکردنی قورئان یەک شتە ئەویش کارکردن بە قورئانە گەر ئەم ئامانجە نەهاتە دی ئەوا هیچ سودێک لە ئەوانی تردا نیە.





## تەدەبور (التدبر) چییە ؟

پێش ئەوەی باسی تەدەبور لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بکەین ئەبێ بزانین تەدەبور چیە ؟ التدبر لە رووی زمانەوانی و شەرعەوە هەر هەمان مانای هەیە بە پێچەوانەی زۆربەی زاراوەکانی تر کە لە رووی زمانەوانی و شەرعەوە مانایان جیایە

تەدەبور لە رووی زمانەوانیەوە (لغة):

الزجاج ئەڵێ: تەدەبور بریتیە لە روانین لە کۆتایی شتێک
ابن فارس ئەڵێ: (دبر) ئەصلی ئەم ووشەیە زۆرینەی لە یەک قیاس دایە ئەویش بریتیە لە کۆتایی شتێک.
الجرجاني ئەڵێ: عیبادەتە لە روانین بۆ کۆتایی شتەکان شتێکی نزیکە لە بیرکردنەوە (التفکر) بەلام بیرکردنەوە تەصەرۆفی دلە بە روانین لە بەلگەوە تەدەبور تەصەروفی دڵە بە روانین لە کۆتایی.





تەدەبور لە رووی شەرعەوە (اصطلاحا):

ابن عطية دەڵێ: تەدەبور بریتیە لە روانین بۆ کوتایی کارەکان و تەئویلکردنی شتەکان.

البغوي ئەڵێ: بریتیە لە روانین بۆ کوتایی کارەکەوە (دبر)ی هەموو شتێک کوتاییەکەیەتی. (تدبر القرآن واتا لیووردبوونەوەی ماناکانی و روشن بینی نە و شتانە ی تیایدایە).

## جیاوازی نێوان (تەدەبور) و (تەفسیر) چیە ؟

تدبر فراوانترە لە تەفسیر بەو پێیەی الله تعالی داوای لە هەموو مرۆڤێک کردووە کە تەدەبوری قورئان بکات بە زانا و عەوام و کافر و مونافیقەوە (أفلا یتدبرون القرآن لیدبروا آیاتە)، بەلام تەفسیر هەموو کەسێک ناتوانی بیکات تەنها زانایانێک نەبن کە مەلەکەی تەفسیریان هەیە چونکە تەفسیرکردنی قورنان پێویستی بە چەند ئامرازێک هەیە کە ئەبێ لەو کەسەدا بوونی هەبێ کە تەفسیری قورئان ئەکات، وەکو: شارەزاییەکی باش لە زمانی عەرەبی و نحو و صرف و ناسخ و منسوخ و عام و خاص و مطلق و مقید و ئاگادار بوون و شارەزاییەکی باش بە تەفسیری سەلەف





هەروەها بەلاغە و چەند علمێکی تر کە زۆر تا کەم بە سوودە بۆ کەسی موفەسیر هەروەک ابن حزم ئەڵێ : گەر تەدەبور لە توانای مرۆڤدا نەبوایە ئەوا الله تعالى داوای لێنەدەکردن چونکە (لا يكلف الله نفسا إلا وسعها) بەلام ئەمەش مانای ئە وە نیە هەر کەسێکی عەوام ویستی تەدەبور لە قورئان بکات هەر ئایەتێکی خوێندەوە بەبێ گەرانەوە بۆ تەفسیر یان ووتەی هیچ زانایەک لە سەری بە تێگەیشتنی خۆی تەدەبوری تیا بکات و بلاوی بکاتەوە و بلێ ئەم ئایەتە ئەمە ئەگەینێ، لە کاتێکدا تەدەبورەکەی ئەو پێچەوانەی تەفسیری هەموو زانایان بن یان هیچ پەیوەندی بە مانای ئایەتەکەوە نەبێ. بێگومان ئەبێ سەرەتا بگەرێتەوە سەر تەفسیرێکی ئاسان مانای ئایەتەکە بە کورتی بزانێ ئینجا لە چوارچێوەی ئەم مانایەدا تەدەبور بکا بەڵام لەگەل ئەوەشدا هەندێک ئایەت هەیە لە قورئاندا کەسێک تەنها عەرەبی بزانی ئەتوانی تەدەبوری تیادا بکات بەبێ گەرانەوە بۆ هیچ کتێبیکی تەفسیر و ووتەی هیچ زانایەک هەروەک ابن عباس رضي الله عنه دەفەرموێت: {تەفسیر چوار جۆرە جۆرێکیان کەس عوزری نیە بلێ نایزانم جۆرێکیان عەرەب ئەیزانێ بەهۆی زمانەکەیەوە جۆرێکیان زانایان ئەیزانن جۆرێکیان کەس نایزانێ جگە لە الله تعالى}.





جا جۆری یەکەمیان هیچ کەس عوزری نیە بە نەزانینی ، وە کو ئەگێرنەوە دوو پیاو بووە دەمە قالێیان لەسەر ئەوەی کە خەلکانێک سوجدە بۆ گۆر ئەبەن یەکێکیان ووتی: ئەمە کوفرە الله تعالى فە رموویەتی« و أن المساجد الله فلا تدعوا مع الله أحدا) [الجن: ١٨] . ئەوی تریان ووتی: کەسانێ وەکو من و تو بۆمان نیە تەفسیری قورئان بکەین پیاوە کە بێدەنگ بوو تاکو کچی پیاوەکەی تر دەرکەوت ووتی: ئەم کچە کییە ؟ ووتی: کچی خۆمە ئەویش ووتی بۆ نایخوازی ؟ پیاوەکە پێکەنی ووتی کچی خۆم بخوازم ؟ ئەویش ووتی بۆ کێشەی چیە ؟ پیاوە کە ووتی نایا نەتبیستووە الله تعالى فەرموویەتی: (حرمت عليكم أمهاتكم وبناتكم ...)واتا دایکانتان و کچانتان حەڕامن بۆتان پیاوەکەش ووتی: تۆ ئەلێی کەسانی وەکو من و تۆ نابێ قورئان تەفسیر بکەن !!!

جا هەندێک ئایەت هەیە تەنها بە تێگەیشتن لە ماناکەی ئەتوانی لێی تبگەی و تەدەبووری تێدا بکەی ، وە بابەتی تەدەبور زۆر فراوانترە لە تەفسیر من ئەتوانم بە جۆرێک تەدەبور بکەم ، تۆش بە جۆرێکی تر وە کەسێکی تر بە جۆرێکی تر لە کاتێکدا هەرسێکمان بە یەک مانا تێگەیشتووین

لە ئایەتەکە و هاوڕاین لە تەفسیرکردنی.





لە کۆتاییدا تەدەبور شتێکی قورس و ئالۆز نیە کە کەسی عەوام بیری لێنەکاتەوە ، گەر وا بوایە الله تعالی داوای لێنەئەکردین تەدەبور بکەین ، وە بەم جۆرەش نیە بە بێ زانینی هیچ تەفسیرێک و نەزانینی عەرەبی دانیشیت ئایەت بە ئایەت تەدەبور بکەی بە جۆرێک کە هەرگیز یەکناگرێتەوە لەگەل مانای ئایەتەکەدا.

## پەیوەندی نێوان تەدەبور و تەفسیر بە رەئی

ئایا تەدەبور واتا تەفسیرکردنی قورئان بەرەئی خۆمان ؟؟؟.
لە زنجیرەی پێشوو جیاوازی نێوان (التدبر و التفسیر)مان باسکرد وە ووتمان الله تعالی داوای لە هەموو مرۆڤێک کردووە بە کافر و موسلمانەوە بە عەوام و زاناوە کە تەدەبور بکات لە قورئانی پیرۆزدا هەروەک فەرموویەتی: {أفلا يتدبرون القرآن} [محمد: ٢٤] بەلام باسی ئەوەشمان کرد کە تەدەبور مانای ئەوە نیە هەر کەسێک هەلسێ بە بێ زانینی عەرەبی یان بەبێ زانینی تەفسیر و مانای ئایەتەکە لە خۆیەوە قسە بکات دەربارەی قورئان ، لە ژێر ناونیشانی تەدەبور لە کاتێکدا قسەکانی ئەو هیچ پەیوەندییان بە ئایەتەکەوە نیە ئەمەش بە هۆی







لاوازیەکی زۆر لە زمانی عەرەبی یان نەگەڕانەوە بۆ هیچ تەفسیرێک تاکو لە مانای گشتی ئایەتەکە بگات لە هەمان کاتیشدا ووتمان تەدەبور شتێکی ئاوا ئالۆز و زەحمەتیش نیە کە جگە لە زانای روچوو (الراسخ) کەس بۆی نەبی باسی بکات گە ر وابوایە ئەوا الله تعالى داوای لە هەموو کەسێک نە ئەکرد کە تەدەبور بکات لە قورنان کەواتە ئەوەی مانای گشتی ئایەتەکانی زانی چ بە هۆی زانینی زمانی عەرەبی بێ یان بەهۆی گەرانەوە بۆ تەفسیریکی ئاسان بۆی هەیە بە رەئی خۆی تەدەبور بکات لە قورئاندا ؟؟؟

ئەبێ موسلمانان ئەوە بزانن کە قسەکردن بە ناوی الله و دەربارەی الله و کەلامی الله بە بێ عیلم شتێکی زۆر گەورە و ترسناکە و هەرەشەی لەسەرە هەروەک الله تعالى فەرموویەتی: (قل إنما حرم ربي الفواحش ما ظهر منها وما بطن والإثم والبغي بغير الحق وأن تشركوا بالله ما لم ينزل به سلطانا وأن تقولوا على الله ما لا تعلمون) [الأعراف: ٣٣] لێرەدا. الله تعالى باسی حەرام بوونی چەند شتێکی کردووە کە داوێن پیسی و تاوان و زولم و شیرك و قسەکردنە دەربارەی الله تعالى بە بێ عیلم سەیرکەن قسەکردنی بێ عیلم دەربارەی الله تعالى ، لەگەل شیرك و









زولم و تاوان و داوێن پیسی هێناوە هەروەها سەرزەنشتی اهلی الكتابى كردووە كە ووتەكانیان گۆڕیوە و ماناكانیان تەحریف كردووە و لە ماناى ڕاستی لایانداوە قال تعالى: (وإن منهم لفريقا يلوون السنتهم بالكتاب لتحسبوه من الكتاب وما هو من الكتاب ويقولون هو من عند الله وما هو من عند الله ويقولون على الله الكذب وهم يعلمون) [آل عمران: ٧٨]، واتا كە سانێكیان تیادایە لە یەهود زمانیان لار نەكەنەوە لە كاتی خوێندنەوەی تەورات بۆ گۆڕینی لەفزەكەی و ماناكەی تاوەكو وای بۆ خەلكی نیشان بدەن كە ئەمە لە كتێبی الله دایە كەچی ئەمە لە كتێبی الله دا نیەوە ئەلێن ئەمە لە لای الله هاتووە كەچی لە لای الله نەهاتووە وە دەربارە ی الله تعالى شتانێكی درۆ ئەلێن كە ئەشزانن درۆیە.

جا هەركاتێك قسەكردن لەسەر ئایەتێكی قورئان بە ڕەئی پێچەوانەی تەفسیری (المأثور) بوو ئەوا ڕەت ئەكرێتەوە تەفسیری (المأثور)یش ئەوەیە كە بەریوایەت گێردراوەتەوە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم یان هاوەڵانی رضي الله عنهم یان زانایانی تابعینی موفەسیر رحمهم الله بۆیە ئەبێ ئاگاداری ئەم خالە بن بە ووردی ، تەدەبوركردنی قورئان هوكارێكە بۆ جوانتر تێگەیشتن لە قورئان نەك بریتی بێ لە كردنەوەی





دەرگا بۆ زندیقەکانی سەردەم کە بە شێوەیەک دەربارەی ئایەتەکان قسە ئەکەن نە شەرع ڕێگای پێداوە نە زمانی عەرەبیش قبولی ئەم مانایانە ئەکات هەروەک سەلەف ووتوویانە هەر کەسێک دەربارەی قورئان قسە بکات بە ڕەئی ئەوا هەڵەی کردووە ئەگەر چی بشپێکێ جا بۆیە موسلمانێکی عەوام کاتێک ئەیەوێ تەدەبور لە ئایەتەکانی قورئاندا بکات بەلام هیچ تەفسیرێکی زانایانی متمانە پێکراوی نەخوێندوتەوە یان عەرەبیەکەی بەشی ئەوە ناکات مانای گشتی ئایەتێکی پێ بزانێ لەگەل ئەمەشدا بە جۆرێک تەدەبور لە ئایەتەکاندا ئەکات ، لەم کاتەدا بۆی نیە ئەم شتە بلاوبکاتەوە لە نێو خەڵکیدا یان پۆستی بکات لە تۆرەکۆمەلایەتییەکاندا تاوەکو دلنیا ئەبێتەوە تەدەبورەکەی دژی مانای گشتی ئایەتەکە نیە و پێچەوانەی تەفسیری زانا متمانەپێکراوەکان نیە چونکە لە کۆتاییدا تەدەبوریش قسەکردنە دەربارەی کەلامی الله تعالی بەلام بە شێوەیەکی فراوانتر لە تەفسیر.

## مەرجەکانی (تەدەبور) چین ؟

ئەگەرچی تەدەبور کردنی قورئانی پیروز شتێکی گرنگ و پێویستە بەڵام پێویستە لەسەر کەسی تەدەبورکەر (متدبر) ڕەچاوی چەند شتێک بکات





لە کاتی تەدەبورکردنی قورئاندا بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە تەدەبورەکانیان بلاو ئەکەنەوە بۆ خەڵکی.

١- دوورکەوتنە لەو مانایانەی کە پێچەوانەی عەقیدەی صەحیحە وەک ئەوەی ئەهلی بیدعە و مەدرەسە عەقڵانیەکان ئەنجامی ئەدەن بە ناوی تەدەبورکردن لە قورئان لە کاتێکدا هیچ نیە جگە لە دژایەتی قورئان و گۆرینی ماناکانی.

٢- ئەو تەدەبورەی ئەیکەی ئەبێ موافقی زمانی عەرەبی صەحیح بن چونکە قورئان بە زمانی عەرەبی دا بەزیوە ناکرێ مانای ئایەتێک یان ووشەیەک بە جۆرێک لێک بدرێتەوە کە عەرەبی ڕەسەن ئەم شتەی هەرگیز نەبیستووە و لە زمانی ئەودا بوونی نیە.

٣- دوورکەوتنە لە شتی نامۆ و رۆچوونی قول لە دەرهێنانی مانا لە ئایەتەکاندا ، چونکە تەدەبور بۆ ڕوونکردنەوە و نزیککردنەوەی ماناکانی قورئانە نەک باسکردنی شتی نامۆ و شاز.







٤- دوورکەوتنەوە لە تەفسیرە باطنیەکان ئەوانەی کە ئەڵێن ئایەتەکان مانایەکی تری شاراوەیان هەیە ، بە پێچەوانەی مانا رووکەشەکەی وەکو ئەوەی ڕافیزە باطنیەکان ئەنجامی ئەدەن لە تەفسیری قورئان .

٥- تەدەبورکردن واتای خوارکردنەوەی دەقە قورئانیەکان و زۆر لە خۆکردن نیە بۆ بەڵگەهینانەوە بە ئایەتەکان ، بۆ نموونە کەسێک بابەتێکی هەیە ئەیەوێ باسی بکات و دەولەمەندی بکات بە دەقە قورئانیەکان ، بە زۆر ئایەتێک ئەهێنێت و لەگەل بیرۆکەکەی ئەیگونجێنێ گوایە گەر تەدەبور لەم ئایەتە دابکەین ئەوا هەمان ئەو مانایە ئەدات کە خاوەنی بابەتەکە مەبەستیەتی ، ناکرێ بە زۆر ئایەتەکان بگونجێنین لەگەل فکرەو هەوا و ئارەزووەکانمان قورئان کەلامی الله یە ئەبێ بە گوێرەی مەبەستی الله تعالى لە ئایەتەکان بڕوانین، نەک گونجاندنی لەگەل فکرەکانی خۆمان.

٦- ئەو شتەی کەسی تەدەبورکەر پێی ئەگات لەکاتی تەدەبورکردن لە ئایەتەکان نابێ پێچەوانەی تەفسیری زانایانی موعتەبەری ئوممەت بن کە کەس تا ئێستا ڕەخنەی نەبووە لە تەفسیرەکەیان بۆ ئەم ئایەتە ، کەچی تۆ هاتووی بە جۆریک تەدەبوری ئایەتەکەت کردووە دژی تەفسیری هەموویانە یان زۆرینەیان .





٧_ ئەو کەسەی توانای جێبەجێ کردنی ئەم خاڵانەی نیە لە کاتی تەدەبورکردنی قورئانی پیرۆزدا ،بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە پێی توانای تەدەبوری تیایدا ئەکات ، ئەو مانایەی کە ئەو پێیگەیشتووە دەتوانێت لە کەسێک بپرسێ کە شارەزایی هەبێت لە بوارەکەدا ، تا بتوانێت مانا راست و هەڵەکانی بۆ دەست نیشان بکاتن .

لە کۆتاییدا دەڵێن (تەدەبور) دەبێ بە ئوصلوبێکی جوان و دروست بکرێ ، نەک (تەدەبور) بکرێتە پردێک بۆ جوانکردنی فکری هەڵەو کوفری پەنا بە الله ، هەروەک دەبینین لە زۆر شوێن و لە لایان زۆر کەسی بەناو بانگخواز و مامۆستای ئایینی ئایەتەکانی قورئان بۆ شەرعیدان بە کوفر بەکارهێنراوە !!.



## بۆ ئەوەی کاریگەری قورئان هەست پێ بکەیت

دوورکەوتنەوە لە شیرکی ئاشکرا و شاراوە ، چونکە بە هەبوونی شیرک (کوفر) چێ گەورە بێت کە لە دین دەتباتە دەرەوە ، چێ بچووک بێت وەکو (ریبا) هیچ کردەوەیەک سوودی نیە بۆ خاوەنەکەی ، ئەگەرچی بە تەجوید و تەدەبوریش بێ خوێندنەوەکەی قورئانی ، الله تعالى دەفەرموێت:
{وَقَدِمْنَآ إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَهُ هَبَآءً مَّنثُورًا}. [الفرقان ٢٣]
ئیخلاص و تەوحید کلیلی تێگەیشتنی علم و تێگەیشتنە ، جا نیەتت لە خوێندنەوەی قورئان و لەبەکردنی و تەدەبور کردنی و کارپێکردنی تەنها لە پێناو الله تعالى بێت ، نەک بۆ بە دەست هێنانی بەرژەوەندی دونیایی و مەعنەوی وەک پارە پەیدا کردن پێی و حەزبکەی بە ناوبانگ پەیدا کردن و مەدح و ستایش کردن لە لایان خەڵکەوە یان بەدەست هێنانی پۆست و مەقام ، بۆیە هەموو کات بەردەوام خۆت بپارێزە لە کوفر و شیرکی گەورە و بچووک ، تا نەکا پەنا بە الله کردەوەکانت پووچەل ببنەوە و خەسارەتمەند بی .وە بزانە هیچ کردەوەیەک قەبول نابێ ئیلا دەبێ سەرەتا بە خالصی بۆ الله تعالى ئەنجامی بدەیت ، وە مەرجی دووەم موافقی



شەرع بێت و شتێک لە خۆتەوە بە ناوی دین ئەنجام نەدەی کە بەڵگەی لەسەر نەهاتبێ !

الله تعالی لە فەرموودەیەکی قودسی دەفەرموێت: (من عمل عملا أشرك فيه غيري تركته وشركه) [رواه مسلم ٢٩٨٥]. واتا: هەر کەسێک کردەوەیەک ئەنجام بدات کەسێکی تر بکات بە شەریکم لە نیەتەکەیدا ئەوا کردەوەکەیی و شەریکەکەی بە جێ ئەهێلم .

واتە کردەوەکە بەتاڵە لە لای الله تعالی و قبولی ناکات بەڵکو بە جێی ئەهێلێ بۆ شە ریکەکەی با ئەو پاداشتی کردەوەی بداتەوە.

جا هەرکاتێک موسلمان تەوحیدی بەدیهینا لە خۆیدا و ئیمانی زیادی کرد الله تعالی دەرگای تەدەبور و تێگەیشتن لە مانای ئایەتەکانی بە سەردا ئەکاتەوە.

خاڵێکی تر ئەوەیە هەوڵ بدە تا دەتوانی بە دەست نوێژەوە قورئان بخوێنیت ، وە روو بکەیتە قیبلە ، وە پێش وەخت سیواک بکەیت ، وە بە تەرتیل و لەسەر خۆییەوە قورئان بخوێنە ، ڕەچاوی یاساکانی تەجوید بکە لەگەل خۆشکردنی دەنگ، الله تعالی دەفەرموێت: {وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا} [المزمل ٤]





گەر باوێشکت هات و قورئانت دەخوێند واز لە قورئان خوێندنەکەت بێنە تا باوێشکت نامینێت.

لە کاتی خوێندنەوەدا ماناکەی لە بیرت بێت و خشۆعت هەبێت لەگەل هەموو خوێندەوەکدا وە بیر لە مانای و مەبەستەکانی تاک تاکی ئایەتەکان بکە ، لە کاتی خوێندنی ئایەتێک کە تەسبیحی تێدایە (سبحان الله ) بکە ، گەر گەیشتە ئەو ئایەتانەی باسی رەحمەت و بەهەشت دەکرێ بوەستە و داوای رەحمەت و بەزەیی الله بکە و داوای بەهەشت بکە ، گەر گەیشتیە ئەو ئایەتانەی باسی سزای الله و ئاگری دۆزەخ کرا ، پەنا بگرە بە الله تعالی لە و سزایە و توورەبوونی ، هەندێ جار لەسەر موصحەف بخوێنە و هەندێ جار لەبەر (بە حیفز) تا هەردوو پاداشتەکە وەربگری بە ئیزنی الله تعالی.

وردبەوە لە ئایەتەکان ماناکەی تێبگە دەتوانی سەرەتا تەرجومەکەی سەیر کەی و پاشان سەیری چەند تەفسیری باش و گرنگ لە موفەسسیرینی سەلەف بکەیت تا باش و جوان لە ئایەتەکە تبگەیت ، وە بزانە ئامانج و سوود و ئامۆژگاریەکانی ئەو ئایەتەی دەخوێنی یان سورەتەکە چیە و ئەمری بەچی دەکا ؟ و نەهی لە چی دەکا ؟ و ملکەچ بە بۆ فەرمانەکانی ، وە هەموومان کەمتەرخەمیمان هەیە بۆیە کە دەگەیتە



هەر ئایەتێک کە دەزانی باسی ئەو خالەیە کە لە تۆ دایە داوای لێبوردن لە الله بکە و تۆبەی لەسەر بکە وە کە گەیشتیە ئەو ئایەتانەی سیفاتی باش باس دەکا و لە تۆش دا مەوجوودە ئەوا سۆپاسی الله بکەو داوای بەردەوامی و نیەت پاکی بکە الله تعالی .

وەرگرتنی پەند لە ئایەتەکان وە بەراورد کردنی بە حالی ژیانی خۆت تۆ لە کوێی ئەم ئایەتانەدا دایت ؟ بەستنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە واقیعی ژیانت نیشانەی تەدەبورکردنە.

کاتێک کەوا دادەنیشت بۆ خوێندنەوەی قورئان یان لاپەڕەیەکی نوێ دەکەیتەوە بۆ ئەوەی حفظ بکەیت یان تفسیری دەکەیت یان موراجەی دەکەیتەوە و تدبری تێدا دەکەیت ، یان لە تۆرە کۆمەلایەتیەکان دەیبینی یان گوێی دەگریت لە قورئان ، هیچ لەمانە کارێکی ئاسان نیە، بەلکو الله تعالی تەوفیقت دەدات ، بە شتێکی زۆر ئاسان سەیری مەکە. تۆ کەوتیتە بەر رەحمی الله تعالی و بۆیە سپاس گوزار بە.

ئەگەر بتەوێت شارەزابیت لە قورئانی پیرۆز پێویستە کاتێکی تایبەتی خۆتی بۆ تەرخان بکەیت و خەلْوەت بکێشیت و بە خشوع و ملکەچییەوە بچیتە خزمەتی بۆ بەدیهێنانی ئەمەش ئامادەکاری پێشوەختەت دەوێت و



پێویستت بەوە هەیە لە ژینگەیەکی ئارامداو دوور لە جەنجاڵی و ژاوە ژاو بچیتە خزمەتی قورئان ئەگەر بەو شێوازەت کرد ئەوە سەرئەنجام ئەوەی پێشتر نەتبینیوەو لێت شاراوە بووە لە ئارامی و ئاسودەیی دەرون بەو هۆکارەوە پێت دەبەخشرێت.

کاتێک بە بیستنی قورئانی پیرۆز هەستت بە زیاد بوونی ئیمان کرد ، ئەوا نیشانەی هەبوونی کاریگەری قورئانە بەسەرتەوە ، وە هەرکاتێک بە بیستنی قورئان یان خوێندنەوەی هیچ گۆرانێک بەسەر دڵتدا نەهات و هەست بە زیاد بوونی ئیمان نەکرد ، ئەوا نیشانەی دووری نێوان تۆ و قورئانی پیرۆزە وە پێویستت بە گۆرانکاریە و تەدەبور کردن لە مانای ئایەتەکاندا تا هەست بە گۆرانکاری بکەیت .

الله تعالى دەفەرموێت: {إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ} [الأنفال ٢]

واتە: بێگومان باوەڕدارانی ڕاستەقینە بە خوای پەروەردگار ئەوانەن کە هەر کاتێك خوای پەروەردگاریان یادبخرێتەوە دڵیان ڕادەچەڵەکێت و ترسیان لێدەنیشیت، وە کە ئایەتەکانی قورئانیان بە سەردا ئەخوێنرێتەوە لەگەڵ ئەو باوەڕەی کەهەیانە هێندەی تر باوەڕیان زیاد ئەکات، چونکە لە





ماناکانی ورد ئەبنەوە و ڕادەمێنن، وە تەنها پشت بەخوای پەروەردگار ئەبەستن .

وە دەفەرموێت: {وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا} [الفرقان ٧٣]

واتە:ئەوانەی کاتێک بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاریان بێدار بکرێنەوە، هەروا بەکەڕی و کوێری بەلایاندا تێناپەڕن (بەڵکو تێدەفکرن و لێکی دەدەنەوەو پاشان پەیڕەوی دەکەن)

وە دەفەرموێت: {ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودهمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ} [الزمر ٢٣]

واتە: الله تعالی جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە قورئانێکە (کە ئایەتەکانی) لە یەکچووی دووپات کراوەن ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیادێ (بە بیستنی قورئان) پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی الله تعالی ئەو (قورئانە) ڕێنموونی الله یە بەو (قورئانە) ڕێنموونی هەر کەسێ دەکات کە بیەوێ هەرکەسیش الله تعالی گومڕای بکات ئەوە ڕێنموونی کەرێك بۆ ئەو نییە.





## بۆ تێگەیشتن لە قورئان و کاریگەری لەسەرت ئەم خالانە جێ بکە:

١. دڵ پڕبوون لە گەورەیی و مەزنی الله تعالی

٢. ڕاستێتی حەزکردن بە سوودوەرگرتن لە قورئان.

٣. وازهێنان لە تاوان و سەرپێچی و ڕووکردنە تەقواو الله پەرستی.

٤. کۆکردنەوەی دڵ و ناخ و گوێ شل کردن بۆ بیستنی قورئان لەکاتی خوێندنیدا.

٥. هەست کردن بەو ڕاستیەی کە قورئان ئاراستەی ئەو کراوەو پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەووەوە هەیە.

٦. هەوڵدان بۆ خوێندنەوەی قورئان بەجوانی و تەواوەتی لەگەڵ دەنگخۆشیدا.

٧. دووبارەکردنەوەی خوێندنی ئایەت بۆ چەندین جار و پەیوەست بوون بە قورئانەوە بە دووبارەکردنەوەی و ئامادەبوونی بیرۆ هۆشت.

٨. سەرنجدان و سەیرکردنی حاڵی پێغەمبەر ﷺ و پێشینان لەگەڵ قورئاندا.



٩. خوێندنەوەی قورئان بە مەبەستی بە دەست هێنانی زانست و ئەجر و پاداشت وە بە ئامانجی کردەوە پێکردنی.
واتە خۆی بە دوور بگرێت لەو شتانەی قورئان قەدەغەی لێکردووە و کار بەم فەرمانانە بکاتن کە قورئان ئەمری پێ کردووە.
١٠.خوێندنەوەی قورئان بە ئامانجی دوعا و پارانەوە.
١١. یەقینت هەبیتن کە قورئان دەخوێنیتەوە الله تعالی دەتبینێت و دەتبیستێت کە قورئان دەخوێنیتەوە وە الله تعالی ئەوەی بتەوێ پێت دەبەخشێ ئەگەر بە حەق و راستی لەگەڵ قورئان بیت.
١٢. خوێندنەوەی قورئان بە مەبەستی شیفا و چارەسەری جەستەیی و دەروونی . { وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا } [الإسراء ٨٢]
١٣.تاوانەکان گەورەترین رێگرن لە تێگەیشتن و خوێندنەوەی قورئان ، هەتا وەکو تاوان کەمتر بێت دڵت زیاتر پاک دەبێتەوە و زیاتر بەرەو قورئان هەنگاو دەنێت و لیی تێدەگەیت .
١٤ _ بزانە کە سەرفرازی دونیا و قیامەت بەستراوە بە قورئانەوە ، ئەگەر کورترین رێگات دەوێ بۆ سەرکەوتن ئەوا دەستگرتوو بە تێگەیشتن و



کردەوە پێ کردنی قورئان ، بەو جۆرە هێمنی و لەسەر خۆییەکی تایبەتت پێ دەبەخشێ و یارمەتیدەر دەبێت لەسەر بڕیار دان لە کارەکانی ژیانت.

خوێندنی قورئان بە تدبر و تێگەیشتنەوە .

ئیبن جریر دەلێ: سەرم سوڕماوە لەو کەسەی کە قورئان دەخۆینێ و ماناکەی نازانێ،چۆن چێژ لەم خوێندنەوەیە دەبینێ
[جامع البيان لأبي جعفر الطبري]

سەعید کوری جبیر دەفەرموێت: هەر کەسێک قورئان بخوێنێتە وە پاشان تەفسیری نەکات و نەیزانێت - وەک نابینا یان دەشتەکی و هیچ نەزان وایە.
[تفسير الطبري ١/٨١]





## هۆکاری بێزاربوونمان لە قورئان خوێندن، تەنها پیسی دڵەکانمانە

عثمان بن عفان رضي الله عنه ئەڵێ: ئەگەر دڵەکانمان پاک ببنەوە هەرگیز تێر نابن لە کەلامی الله.

[حلية الأولياء ٧ / ٢٧٢]

عبد الله بن مسعود دەفەرموێت: هەرکەس زانستی دەوێت! با بیربکاتەوە و تێڕامێنێ لە قورئان چونکە لەقورئاندا! زانستی سەرەتاکان و کۆتاییەکانی تێدایە لەوانەی ڕابردون و دێن

[مسند كما في المطالب العالية]

الضحاك رحمه الله دەفەرموێت: سەردەمێک بەسەر خەڵکدا دێت قورئانەکان هەڵدەواسرێن تا وای لێدێت جاڵجاڵۆلە هێلانەی تێیدا درووست دەکات هیچ سودێک نامینێت لەوەی تێیدایە

[جامع بيان العلم ٢ /١٠٢٣]





چۆن دڵت نەرم ئەبێ بە قورڕئان خوێندنەوە لەکاتێکدا هەموو هەوڵت ئەوەیە بگەیت بەکۆتایی سورەتەکە ؟
کاتێک قورڕئان ئەگرینە دەست لەبری تێرامان و تێگەیشتن لە ئایەتەکان، بیر بکەینەوە بزانین باسی چی ئەکات چ پەندێکی تێدایە بۆمان، لەبری ئەمانە بیر لەوە ئەکەینەوە کەی ئەگەین بەکۆتایی سورەتەکە تا زوو قورڕئانەکە دابخەین.

عبدالله کوری مەسعود الله لێ رازی بێت ئەفەرموێت: ئەو ماڵەی قورئانی تێدا ناخوێندرێت وەکو ماڵێکی وێران و کەلاوە وایە کە ئاوەدانی و کەسی تێدا نەژی بێت..
[مصنف ابن ابي شيبە ٣٠٥٢٣]

قورئان زۆر بخوێنە وازی لێ نەهێنیت چونکە قورئان ئەو شتەت بۆ ئاسان دەکات کە داوای دەکەیت بە پێی خوێندنەوەت بۆی.

ئەبی جەوزاء دەڵێ: گواستنەوەی بەرد لەسەر مونافیقین ئاسان ترە لە خوێندنی قورئان
[حلية الأولياء ٣/ ٨٠]





لە عَبْدِ الْوَاحِدِ بْنِ صَفْوَانەوە وتی: گوێم لە حەسەن بوو دەیوت: زەمانێک دێت بەسەر خەڵکیدا قورئان دەکەنە دەنگ خۆشی

[البدع لابن وضاح]

واتە هەموو کارکردنیان بە قورئان بریتی دەبێ لەوەی بەدەنگی خۆش بیڕازێننەوە ئەمڕۆ ئەو شتە زۆر ڕون دیارە

ئەگەر لە قورئاندا بە دوای وشەی ( زۆرینەی خەڵک ) بگەڕێی ئەمانە دەبینی

- أَكْثَرهمْ لَا يَعْلَمُونَ - زۆربەی ئەوانە نەفامن و نازانن.
- أَكْثَرەمْ لَا يَشْكُرُونَ - زۆربەیان ناسوپاسگوزار و بێ ئەمەکن.
- أَكْثَرەمْ لَا يُؤْمِنُونَ - زۆربەی زۆریان باوەڕ ناەێنن.
- أَكْثَرەمُ الْفَاسِقُونَ - زۆربەیان گوناەبارو تاوانکارن.
- أَكْثَرەمْ يَجْهَلُونَ - زۆربەیان نافامن و نازانن.
- أَكْثَرەمْ لَا يَعْقِلُونَ - زۆربەشیان ژیر نابن.

٢- بەڵام ئەگەر بەدوای ( کەمینەی خەڵک ) بگەڕێی لە قورئاندا ئەمانە دەبینی:

- قَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ - کەمێك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن.



- مَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ - کەسیش بڕوای بەنوح نەکردو لەگەڵیدا نەبوو، جگە لەکەسانێکی کەم نەبێت.
- وَقَلِيلٌ مِّنَ الْآخِرِينَ - دەستەیەکی کەمیشیان لەوانەن کەدواتر (بەشوێن ئەواندا ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر).

کەواتە! زۆری هەموو کات پێوەر نییە بۆ حەق بەڵکو ئەوە پێوەرە حەق کە شوێن سوننەت کەوتوە شوێن صەحابەو تابیعین ئەگەر خۆی بەتەنیا بێت وەک چۆن نعیم کوڕی حماد دەڵێت: ئەگەر جەماعەت خراپ و فەساد بوو، ئەوا دەست بگرە بەوەی جەماعەت لەسەری بوو پێش ئەوەی خراپ و فەساد بێت، ئەگەر چی بەتەنیاش بیت، ئەو بەڕاستی تۆ تەنها جەماعەتیت لەو کاتەدا.

[شرح اصول اعتقاد اللالكائى ١/١٢٢]

تاکە جەماعەتێکیش کە موسلمان دەستی پیوە بگرێت و شوێنیان بکەوێت، هاوەڵان و تابعین و زانایانی ئەهلی سونەن، لە عەقیدە و ئەخلاق و ڕەوشتت دەست بگرە بە ئاثار و پاشماوەی ئەوانەوە دڵنیابە لەسەر حەق و ڕێگا ڕاستەکەی ئەگەر چی بەتەنهاش بیت لە زەمانی خۆتدا



گەر بینیت تۆز لەسەر قورئانەکەتە
ئەوا تۆزی سەر دڵت گەلێ زیاترێکە

هەر دڵێک لەگەڵ قورئاندا بژییێت بێگومان شیرینی ئیمان دەچێژێ ، بەڵام ئەمە کاتێکە کە ماناکەی تێبگات و کاری پێ بکاتن

لەسەرەتای هەر کتێبێک دەنوسرێت ببورن بۆ هەر هەڵە و کەم و کورییەک بێجگە لە قورئان کە الله تعالی هەر لە سەرەتاوە فەرموویەتی:
{ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِ} [البقرة ٢]
واتە: ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نیە

إبن مسعود (٣٢هـ) رضي الله عنه دەڵێت: هەر کەس حەزدەکات بزانێ الله عز وجل ی خۆش دەوێت، ئەوا با سەیری قورآن بکات، ئەگەر قورآنی خۆشویست ئەوا الله شی خۆشدەوێت، قورآن قسەی(کەلامی) الله یە.
[السنة عبد الله ١٠٦]



ووتم: خۆشویستنی قورئان تەنها بە زووبان نییە بەڵکو بە تەتبیق کردنێتی واتە سنوورەکانی بپارێزی لە حەرامکراوەکانی دوورکەوی و فەرمانەکانی جێبەجی بکەیت.

ڕاستە قورئان ئایەتانێکی زۆری لە باسکردنی چیرۆکی کەسانی پێشوو تەرخانکردووە ، بەڵام هەموو چیرۆکەکان دەربارەی تەوحید و شیرکە تەرکیز لەسەر پەرستنی الله ئەکاتەوە بە تەنها و شەریک بۆ پەیدانەکردنی لە هیچ شتێک ، نەوەک ئەو چیرۆکانەی زۆربەی مەلاکان باسی ئەکەن وەکو ... گەنجێک ٢ی شەو تەلەفۆنی بۆ کردم ووتی تاوانم زۆرە ... ئافرەتێک تەلەفونی کرد ووتی مێردم خراپە ... ئافرەتێک ١٢ شەو خەبەری پێم دا لە زانکۆ هەرەشەی لێکراوە هتد.... هەر خەریکی ئەم چیرۆکانەن بە بێ ئەوەی خەڵک فێرە (تەوحید) بکەن!!

ئەوە هۆکاری تاوانەکان و هەمی زیادکردنی خەتمەکانمانە ، لەبری تەدەبور وتێگەیشتن لێی وا هیچ سوودێک نابینین لە قورئان ونابێتە سەبەبی هیدایەت بۆ عەقیدەی پاک وڕەنگدانەوەی لە کرداردا

عبدالله کوڕی عمر رضی الله عنه: قورئانی دەخوێند کاتێك دەڕۆی بەلای ئەو ئایەتانەی باسی بەهەشت بوو دەوەستاو داوای بەهەشتی لە الله تعالی دەکردو دوعای دەکردو دەگریا، وە کاتێك دەڕۆی بەلای ئەو ئایەتانەی باسی ئاگر بوو دەوەستاو دوعای دەکرد و پەنای دەگرت بە الله تعالی لێی. [الزهد لإمام أحمد ١٠٨٢]

قوڕئان منی پاراست

ئەگەر دڵ تەنگ بم دڵم ئەداتەوە

ئەگەر بێ هێز بم بەهێزم دەکات

ئەگەر لەبیرم کرد بیرم دەخاتەوە

ئەگەر بێ ئاگابووم بەئاگام دەهێنێتەوە

ئەگەر نەمزانی فێرم دەکات

هەست بە خراپی و دڵ تەنگی ناکەم کە لەگەڵ ئەوم

لەبەر ئەوەی قورئان کەلامی الله یە و مخلوق نیە

قتادة فەرموویەتی: قورئان نەخۆشی و دەرمانەکەیمان بۆ دیاری دەکات:

نەخۆشیەکەمان تاوانەکانمانە

دەرمانەکەشی تۆبەکردنە

[شعب الإیمان ٦٧٤٥، التوبة لإبن أبي الدنیا ٩١ ]



الإمام مالك بن أنس دەفەرموێت: گەر توانیت قورئان بکەیت بەپێشەوای خۆت ئەوە وابکە، چونکە ئەوە ڕێنمونی کەرە بۆ بەهەشت.

[الجامع لابن أبي زيد القيرواني ص١١٤]

ئیمام الآجري دەفەرموێت: پێویستە لەسەر ئەو کەسەی الله تعالى دەنگێکی خۆشی پێداوە لە قورئان خوێندنەوەدا، بزانێت کە الله تعالى تایبەتی کردووە بە چاکەیەکی گەورە، جا با قەدری ئەوە بزانێت کە الله تعالى تایبەتی کردووە پێی، وە با قورئان لەبەر الله تعالى بخوێنێت، نەك لەبەر دروستکراوەکانی الله ( مەبەست بۆ ریایی).

[أخلاق حملة القرآن ]

ئەوا سەردەمی خۆی وا دەلێ... ئەی ئێستا !!!

الفضيل کوری عياض دەفەرموێت: بەڕاستی قورئان دابەزی بۆ ئەوەی کاری پێبکرێت بەڵام خەڵکی خوێندنەوەیان کرد بەکارکردن.

[أخلاق حملة القرآن للآجري ]





مرۆڤ لەوە لاوازترە کە بەرگەی ئەو هەموو تاقیکردنەوە و ناخۆشیانەی ژیان بگرێ بەبێ وتەکانی پەروەردگاری ،جا سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەو پەرتووکەی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی ﷺ

الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِه الْكِتَابَ

ابن مسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: هەرکەسێک قورئانی خۆشئەوێت مژدەی لێبێت.

[سنن سعيد بن منصور ٢٩٨٦]

ووتم: خۆشویستنی قورئان بەس بە زووبان نیە بەڵکو دەبێ گوێرایەلی فەرمانەکانی بکەیت و دوور بکەویتەوە لە نەهی لێکراوەکانی کە الله تعالى لە قورئان دا باسی کردووە.

کاتی ئەوە هاتوە سنورەکانی قورئان بپارێزین نەک تەنها حەرفەکانی لە سینەماندا

ساڵانە و مانگانە و ڕۆژانە سەدان حافظ قورئان سەر هەڵئەدەن

بەڵام کارکردن بە قورئانەکە ڕۆژ بەڕۆژ لەکەم بونەوەدایە

بەداخەوە ئەوەش بوەتە بازرگانیەکی نوێ



بەهۆیەوە دەعوەت و دەعوەتکاری ڕێکەخرێت و پارە پەیدا دەکرێت یان بەڤیدۆ بڵاویەکات و بینەر کۆدەکاتەوە تاوەکو شتێکی دەسکەوێت یارب چۆن ئەو دینە غەریب بوە.

إمام الآجري دەڵێ: ئاگاداربە لەوەی هاوشێوەی ئەو کەسە بیت کە خۆی ماندوو دەکات بە لەبەر کردنی حەرف بەحەرفی قورئان، بەڵام گوێ نادات بە بەزاندنی سنوورەکانی .

[الجامع للآجري ١/٤٠٥ ]

ووتم: لەم ڕۆژگارە دا زۆر کەس هەن حافظ قورئان یان زۆربەی قورئانیان لەبەرە بە تەجویدی ریک و پێک بەڵام سەیری عەقیدەی دەکەی کە لە شیرک و بیدعەی تێدایە !! بگرە رەنگە یەک کوفر و دو کوفریش نە چەندین کوفری هەیە لەولاوەشە بە کەسێکی زۆر ئیماندار و ئەولیاء سەیری دەکەن بەس لەبەر ئەوەی قورئانی لەبەرە !!.



أبو جمرة الضبعي دەڵێت: ووتم بە ابن عباس: من خێرام لە خوێندنەوەی قورئان هەموو قورئان دەخوێنمەوە لە سێ رۆژدا ، پێی ووتم: گەر من سورەتی البقرة بخوێنم لە شەوێکدا بە تەدەبور و ووردبونەوە و بە جوانی و بە هێمنی ئەوا لام خۆشەویسترە لە وەی بخوێنمەوە وەک خوێندنەوەی تۆ.

[الجامع الشعب الإيمان]

محمد کوری کعب القرظي دەڵێت: گەر لە تەواوی شەوێکدا {إذا زلزلت}. وە {القارعة} بخوێنم و دووبارەی بکەمەوە و بیری لێبکەمەوە خۆشەویسترە لە لام لە وەی تەواوی قورئان بخوێنم بەپەلە.

[مصنف ابن ابي شيبة ٨٩٧٢ ]

ابن مسعود دەفەرموێت : هەرکەسێک قورئان خەتم بکات دوعایەکی گیرا و وەلام دراوەی بۆ هەیە.

[مختصر منهاج القاصدين ١/٥٣]

ئیمامی شافعی دەڵێت: داوای روناکی ناو گۆرمان کرد، دۆزیمانەوە لە خوێندنەوەی قورئان.

[البحور الزاخرة ١/١٨٥ ]



ابن مسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: هەرکەس دەیەوێ زانست فێربێ ئەوا با قورئان بخوێنیتەوە و بیر لە ماناکانی بکاتەوە چونکە زانستی پێشین و پاشینی تێدایە.

[فضائل القرآن للفريابي ٧٨]

ئیمامی الآجري دەفەرموێت: ئایا نابینن ڕەحمەتی الله تان لێبێت کە پەروەردگاری خاوەن قەدرتان کە چۆن هانی درووستکراوەکانی دەدات لەسەر ئەوەی تێرامان بکەن لە کەلامەکەی وە هەرکەس تێرامان لە ووتەکانی پەروەردگاری بکات ئەوە پەروەردگار دەناسێت وە گەورەیی دەسەلات و توانای پەروەردگاری بۆ دەردەکەوێت، وە گەورەیی ئەو فەزل و چاکانەیشی بۆ دەردەکەوێت کە بەسەر ئیمانداراندا رشتوویەتی وە دەزانێت چی پێویستە لە سەری لە پەرستشی پەروەردگار بۆیە خۆی پەیوەست دەکات بەوەی کە پێویستە لەسەری وە دووردەکەوێتەوە لە وەی پەروەردگار ئاگاداری کردووەتەوە لیێ وە حەز بەو شتانە دەکات کە پەروەردگار پێی فەرمووە و لای خۆشەویستکردووە لە ڕێی قورئانەکەیەوە.

وە هەر کەسێک ئەمە سیفاتی بێت لە کاتی خوێندنی قورئان و لەساتی گوێبیستبوونی لە کەسێکی تر ئەوە قورئان دەبێتە چارەسەر بۆی دەولەمەند دەبێت بە بێ پارە بەعیززەت دە بێت بەبێ عەشیرەت و هۆز ، وە ترسی نابێت لەو شتانەی کە غەیری ئەم لێی دەترسن ، وە هەموو هیواو ئاواتی لە کاتی خوێندنەوەی سورەتێکدا کە دەستپێدەکات ئەوەیە کە ئایا چ کاتێک پەند وەردەگرم لەوەی کە دەیخوێنمەوە؟ نەک هەموو مەبەستی ئەوە بێت کە کەی سورەتە کە تەواو دەکەم؟ بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە چ کاتێک ئەو کاتەیە کە لە گفتی پەروەردگارم تێدەکەم؟ کەی دەبێت را بچڵەکێم کەی عیبرەت و پەند وەربگرم لێی؟ چونکە خوێندنەوەی قورئانەکەی پەرستشە وە پەرستشیش بە بێئاگاییەوە ناکرێت پەروەردگار سەرکەوتوومان بکات بۆ ئەوە.

[أخلاق حملة القرآن ص ٤١]



وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم وبارك على نبينا وحبيبنا محمد صلى الله عليه وآله وصحبه أجمعين.

